


ئەیلولی 2015

# چاکسازییەکانی عەبادی و کاریگەرییەکانی

ئامادەکردنی

ئاریان ڕەوف    گەیلان عەباس    ئەلەند مەحوی

ژووری توێژینەوەکان

Tel: 009647481505010

Email: research.gorran@gmail.com

# پێڕست

## پێشەکی

لە کۆتایی حوزەیرانی ساڵی 2015 چەندین خۆپیشاندان لە شارەکانی ناوەڕاست و باشوری عێراق دژ بە نەبونی کارەبا و خراپی خزمەتگوزاریەکان سەریان هەڵدا، بەڵام گشت ئەو ناڕەزایەتیانە نەبونە جێگەی سەرنج و بایەخی حکومەتی عێراقی، تا پریشکی خۆپیشاندانەکان لە 31ی تەموزی 2015 گەیشتە بەغداد، ئەوکات مەرجەعیەتی شیعە پشتیوانی داخوازیەکانیانی خۆپیشاندەرانی کرد و سەرۆك وەزیرانی عێراقیش پرۆژەی چاکسازی هەمەلایەنەی لەو پێناوەدا ڕاگەیاند.

لە ژێر کاریگەری خۆپیشاندەران و پشتیوانیەکانی مەرجەعیەتی شیعەدا، (حەیدەر عەبادی) سەرۆك وەزیرانی عێراق بەرەبەیانی 9ی ئاب پرۆژەیەکی چاکسازیی ڕاگەیاند، ئەوەش بەمەبەستی (کەمکردنەوەی پۆستە حکومییەکان، قەڵاچۆکردنی گەندەڵی، کەمکردنەوەی خەرجییەکانی حکومەت و بایەخدان بە لێوەشاوەیی و بەڕێوەبردن لە دامەزراوەکانی دەوڵەت، کەمکردنەوەی موچەو ئیمتیازات و خانەنشینی پلە تایبەتیەکان ...) کە سەرجەمیان بونەتە هۆکاری سەرەکی لە دڵەراوکێی و نادادی کۆمەڵایەتی لە عێراقدا.

ئەم پرۆژەیە لەدوای پەسەندکردنی لە ئەنجومەنی وەزیران ئاراستەی ئەنجومەنی نوێنەران عێراق کرا. لە بەرامبەردا سەرجەم لایەنە سیاسیەکانی عێراق لە پەرلەمان، پێشوازیان لە بڕیارەکەی عەبادی کرد. چونکە سەرجەمی لایەنەکان هەستیان بە فشار و بەرزبونەوەی ئاستی ناڕەزایەتیەکانی شەقامی عێراق کردبوو، لەبەر ئەم هۆکارەش لە 11ی ئاب 2015 ئەنجومەنی نوێنەران هاوشانی پرۆژەیەکی ئامادەکراوی دیکە لە پەرلەمانەوە دەنگی بەڵێی بەخشییە پرۆژە بڕیارەکەی عەبادی. لە لایەکی دیکەشەوە سەرۆك کۆماری عێراق (فوئاد مەعسوم) لەبەیاننامەیەکدا پشتیوانی خۆیی دەربڕی بۆ پرۆژە چاکسازییەکانی (عەبادی).

سەرەڕای ئەم پشتیوانیە بەرفراوانە، بەڵام پرۆژە چاکسازیەکەی (حەیدەر عەبادی) ڕوبەڕوی کۆمەڵێك لەمپەر و ڕەخنە بووەتەوە. لەمپەرەکان لەلایەن نەیارەکانیەوە دروست دەکرێنو ڕەخنەکانیش باس لەوە دەکەن کە عەبادی سواری شەپۆلی ناڕەزایەتیەکانی خەڵك بووە و پرۆژە چاکسازیەکەی لە شوێنی خۆیەوە دەستی پێنەکردووە، بەڵکو عەبادی دەیەوێت بەناوی چاکسازیەوە پێشێلی دەستورو یاسا بکات و پێگەی خۆی بەهێز و پاوانخوازی شیعە زیاتر بکات.

## کارنامەی پرۆژە چاکسازیەکەی عەبادی

لەسەر بنەمای بەرژەوەندی گشتی و پشت بەستن بە مادەی (78)[1]ی دەستوری عێراق، سەرۆك وەزیرانی عێراق ئەم بڕیارانەی دەرکرد:

1. کەمکردنەوەی گشتگیر و بەپەلە لە ژمارەی پاسەوانی سەرجەم بەرپرسانی وڵات، لە نێویشیاندا هەر سێ سەرۆکایەتییەکە، وەزیران، پەرلەمانتاران، پلە تایبەتەکان، بەڕێوەبەرە گشتیەکان، لەگەڵ پارێزگار و سەرجەم ئەندامانی ئەنجومەنی پارێزگاکان و ئەوانەشی لەو پلەیەدان.

دواتر پاسەوانەکان رەوانەی وەزارەتی بەرگری و ناوخۆ دەکرێن و راهێنانیان پێدەکرێت و ئامادە دەکرێن، تاوەکو ئەرکە نیشتیمانییەکانیان لە پارێزگاریکردن لە نیشتیمان و هاوڵاتیان بەجێ بهێنن.

2. هەڵوەشاندنەوەی سەرجەم دەرماڵە تایبەتەکانی هەرسێ سەرۆکایەتییەکەی وڵات و دەستە و دامەزراوە و خانەنشینان، بەپێی رێنماییەك کە سەرۆك وەزیران دەریدەکات، کە تیایدا دادپەروەری و پیشەیی و پسپۆڕی لە بەرچاو دەگیرێت.

3. لابردنی سەرجەم پۆستە باڵاکان و دەستە سەربەخۆکان و بریکاری وەزیر و راوێژکار و بەڕێوەبەرە گشتییەکان، کە لەسەر بنەمای حیزبی و تائیفی دانراون. دواتر لیژنەیەك کە سەرۆك وەزیران پێکیدەهێنێت، لەسەر بنەمای لێهاتویی و پاکی، بە سود وەرگرتن لە ئەزمونە نیشتیمان و نێودەوڵەتییەکان، کاندیدی نوێ دەستنیشان دەکەن و ئەو کەسانەشی مەرجەکانیان تێدا نەبێت، لە پۆستەکانیان دەبەخشرێن.

4. پوختەکردنی وەزارەت و دەستەکان، لە پێناو بەرزکردنەوەی توانستی کارکردن لە کاری حکومی و کەمکردنەوەی خەرجییەکان.

5. هەڵوەشاندنەوەی پۆستی (جێگرانی سەرۆك کۆمار و سەرۆك وەزیران) بەشێوەیەکی خێرا.

6. هەڵدانەوەی دۆسییەکانی گەندەڵی ئێستا و رابردو، لەژێر سەرپەرشتی لیژنەیەکی باڵا بۆ روبەڕوبونەوەی گەندەڵی، لەسەر بنەمای (ئەمەت لەکوێ بو؟ **من این لك هذا**)، هەروەها راسپاردنی دادگا بۆ ئەوەی پشت بە کۆمەڵێك دادوەری پسپۆڕ و ناسراو ببەستێت لەبواری دەستپاکی، بۆ ئەوەی لێکۆڵینەوە بکەن لە گەندەڵکاران و دادگاییان بکەن.

---

1. ماددەی 78: سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران لێپرسراوی راستەوخۆی پیادەکردنی سیاسەتی گشتی وڵات و سەرکردەی گشتی هێزە چەکدارەکانەو ئەنجومەنی وەزیران بەڕێوەدەبات و سەرۆکایەتی کۆبونەوەکان دەکات. مافی لەکارخستنی وەزیرەکانی هەیە بەرەزامەندی ئەنجومەنی نوێنەران.

بەم شێوەیە عەبادی لە ماوەی مانگێکداو لەچەند کاتێکی جیاوازدا چەند بڕیارێکی ڕاگەیاند، دواتر داوای لە ئەنجومەنی وەزیران کرد ڕەزامەندی لەسەر بڕیارەکان نیشان بدەن و ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقیش بڕیارەکانی پەسەند بکەن، تاوەکو بتوانێت ئەو چاکسازییانە ئەنجام بدات کە مەرجەعە باڵا ئاینییەکانی وڵات و هاوڵاتیان داوایانکردوە، بۆ ڕووبەڕووبونەوەی گەندەڵی و بەدیهێنانی دادپەروەری کۆمەڵایەتی.

## جێبەجێکردنی پرۆژە چاکسازیەکەی عەبادی

حەیدەر عەبادی، ئێوارەی ڕۆژی 16ی ئاب چەند بڕیارێکی وەك قۆناغی یەکەمی جێبەجێکردنی چاکسازی بڵاوکردەوە. لە بڕیارەکەدا هاتووە: لەبەر پێویستییەکانی بەرژەوەندی گشتی و پشتبەست بە مادەی 78 لە دەستور و سەرپشککردنی ئەنجومەنی نوێنەران، بەناوی گەلەوە ئەم بڕیارانەمان دا:

1. کەمکردنەوەی ژمارەی ئەندامانی ئەنجومەنی وەزیران بۆ 22 ئەندام لەگەڵ سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران کە پێشتر 33 ئەندام بوو، ئەوەش بەم شێوەیە:
   - هەڵوەشاندنەوەی پۆستەکانی جێگرانی سەرۆك وەزیران.
   - هەڵوەشاندنەوەی ئەم وەزارەتانە
     أ. وەزارەتی مافەکانی مرۆڤ
     ب. وەزارەتی دەوڵەت بۆ کاروباری ژنان
     ج. وەزارەتی دەوڵەت بۆ کاروباری پارێزگاکان و ئەنجومەنی نوێنەران
     د. وەزارەتی دەوڵەت
2. دووبارە داڕشتنەوەی هەیکەلییەتی ئەم وەزارەتانە:
   أ. یەکخستنی وەزارەتی زانست و تەکنەلۆجیا لەگەڵ وەزارەتی خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستی
   ب. یەکخستنی وەزارەتی ژینگە لەگەڵ وەزارەتی تەندروستی.
   ج. یەکخستنی وەزارەتی شارەوانییەکان لەگەڵ وەزارەتی ئاوەدانکردنەوە و نیشتەجێکردن.
   د. یەکخستنی وەزارەتی گەشتوگوزار و شوێنەوار لەگەڵ وەزارەتی ڕۆشنبیری.
3. ئەمینداریێتی گشتی ئەنجومەنی وەزیران ڕێکارە پێویستەکان دەگرێتەبەر بۆ جێبەجێکردنی ئەوەی لەسەرەوە هاتووە. لە کۆتای بڕیارەکەشدا هاتووە کە ئەم فەرمانە لە ڕێکەوتی دەرچوونییەوە جێبەجێ دەکرێت.

رۆژی سێ شەممە 18ی ئاب نوسینگەی ڕاگەیاندنی سەرۆك وەزیران لە چوارچێوەی جێبەجێکردنی کارنامە چاکسازییەکەی عەبادیدا چەند بڕیارێکی نوێی وەك قۆناغی دووەم چاکسازی ڕاگەیاند، لە بڕیارەکەدا هاتووە پۆستی ڕاوێژکارەکانی لە وەزارەتەکان هەڵوەشاندەوە و ڕاوێژکارەکانی سێ سەرۆکایەتییەکەشی کەم کردەوە.

لە بڕیارەکەدا هاتووە: لەسەر بنەمای ئەو کارنامە چاکسازییەی کە حەیدەر عەبادی، سەرۆك وەزیرانی عێراق پێشکەشی کردووە و ئەنجومەنی وەزیران بڕیاریدا و ئەنجومەنی نوێنەرانیش پەسندی کرد، بڕیار درا بە:

1. هەڵوەشاندنەوەی پۆستی ڕاوێژکاری وەزارەتەکان لە دەرەوەی میلاکاتەکان، ئەگەر لەسەر میلاکی هەمیشەیی بێت یان کاتی.
2. کەمکردنەوەی ڕاوێژکارانی سەرۆکایەتییەکان بۆ پێنج ڕاوێژکار بۆ هەر سەرۆکایەتییەك.

رۆژی 8ی ئەیلول نوسینگەی ڕاگەیاندنی سەرۆك وەزیرانی عێراق، وردەکاری کەمکردنەوەی موچەو دەرماڵەی بەرپرسانی عێراقی ئاشکراکرد، ئەوەش پاش ئەوەی لە کۆبونەوەی ئەنجومەنی وەزیران، بڕیارەکەی حەیدەر عەبادی سەبارەت بە کەمکردنەوەی موچەی پلە باڵاکان پەسەندکرا، لەسەر بنەمای قۆناغی یەکەمی چاکسازییەکانی سەرۆك وەزیرانی عێراق، لە چوارچێوەی چاکسازییە داراییەکاندا، ئەنجومەنی وەزیرانی عێراق لە دانیشتنی رۆژی سێشەممە 8 ئەیلول ئەم بڕیارانەی دەرکرد و لە سەرەتای ئەم مانگەوە جێبەجێ دەکرێن:

**یەکەم:** ئەوانەی لە خزمەت بەردەوامن موچەی بنەڕەتیان بەم شێوەیە ئەژمار دەکرێت:

1. سەرۆکی کۆمار و سەرۆك وەزیران و سەرۆکی پەرلەمان، موچەی بنەڕەتییان 8 ملیۆن دینار دەبێت.
2. جێگرانی سەرۆك کۆمار و سەرۆك وەزیران (بەمەبەستی ئەژمارکردنی موچەی خانەنشینی) و جێگری سەرۆك پەرلەمان 6 ملیۆن دینار دەبێت.
3. وەزیرەکان و ئەوانەی لەو پلەیەدان 4 ملیۆن دینار دەبێت، بریکارەکان و ئەوانەی لەو پلەیەدان و ڕاوێژکارەکان کە موچەی بریکاری وەزارەت وەردەگرن 2 ملیۆن و چواسەد هەزار دینار دەبێت، پلەی تایبەت 2 ملیۆن دینار و بەڕێوەبەری گشتی و ئەوانەی لەو پلەیەدان یەك ملیۆن و پێنج سەد هەزار دینار دەبێت.
4. دەرماڵە بڕیاردراوەکان، کە بەپێی یاسای موچەی فەرمانبەرانی دەوڵەت لە ساڵی (2008) دەرچوە و لێیانبڕاوە، دەخرێتە سەر موچەکانیان کە کەمکراوەتەوە بۆ (50٪).

**دووەم:** خانەنشینکراوەکان

راگرتنی موچەی خانەنشینی کە بە پێی ئەو یاسا و بڕیارانەی کە پێشتر دەرچون، بەوانەی لە دوای 9 نیسان پۆستیان وەرگرتوە، ئەوانیش: سەرۆك کۆمار و جێگرەکانی و ئەندامانی دەستەی سەرۆکایەتی و سەرۆك وەزیران و جێگرەکانی و وەزیرەکان و ئەوانەی لەو پلەیەدابون و سەرۆکی پەرلەمان و جێگرەکانی و ئەندامەکانی پەرلەمان و ئەندامانی ئەنجومەنی حوکم و ئەندامانی ئەنجومەنی نیشتمانی و خاوەن پلە تایبەتەکان و بریکارەکانی وەزارەتەکان و راوێژکارەکان و بەڕێوەبەرە گشتییەکان و ئەوانەی لەو پلانەدان بون، هەروەها سەرۆك و ئەندامانی کۆمسیۆنی هەڵبژاردنەکان و کۆمسیۆنی مافەکانی مرۆڤ و سەرۆك و ئەندامانی دەستەی زیندانییە سیاسییەکان و پارێزگار و جێگرەکانیان و سەرۆکی ئەنجومەنی پارێزگاکان و جێگرەکانیان و ئەندامانی ئەنجومەن و قایمقام و بەڕێوەبەری ناحییەکان.

دواتر موچەی خانەنشینی بەوانە دەدرێت کە پێشتر موچەی خانەنشینییان وەرگرتوە، بەپێی یاسا و بڕیارەکانی پێشو بۆ ئەوانەی لەدوای 9 نیسانی 2003 ەوە بەرپرسیارێتیان وەرگرتوە و خزمەتەکەیان کەمتر نییە لە 15 ساڵ خزمەتی هەبێت و تەمەنی لە 50 ساڵ کەمتر نەبێت، بەپێی برگەکانی مادەی ژمارە 21ی یاسای خانەنشینی یەکگرتو ژمارە 9ی ساڵی 2014. هەروەك موچەی نوێ بەو کەسانە دەدرێت کە بەردەوامن لە خزمەت لە پلە تایبەتەکان لەگەڵ زیادکردنی سەرەموچەی ساڵانە بۆیان.

رۆژی 10ی ئەیلول 2015 نوسینگەی سەرۆك وەزیرانی عێراق لە بەردەوامی قۆناغەکانی چاکسازی بۆ بەرزکردنەوەی توانای دامەزراوەکانی دەوڵەت، سەرۆك وەزیران بڕیاریدا بە:

1. بەخشینی (123) بریکاری وەزیر و بەڕێوەبەری گشتی.
2. خانەنشینکردنی ئەو کەسانە یان گرتنەبەری رێوشوێنی ئیداری بەرامبەریان بەپێی یاسا و رێنماییەکان کەلەلایەن ئەمینداریێتی گشتی ئەنجومەنی وەزیرانەوە دەردەچێت.
3. جێگری بەڕێوەبەری گشتی یان بەڕێوەبەری پێشکەوتوی بەشەکان ئەو فەرمانگانە بەڕێوەدەبەن تا بەڕێوەبەری گشتی نوێ لە شوێنیان دادەمەزرێت.
4. لیژنە تایبەتمەندەکان پێداچونەوە بە پەیکەرەی وەزارەتەکان و ئاست و توانایان و هەڵسەنگاندن بۆ فەرمانبەرانی پلە باڵایان دەکەن و راپۆرت ئاراستەی سەرۆك وەزیران دەکەن بۆ گرتنەبەری بڕیاری پێویست لەبارەیانەوە.

## ئامانجی پرۆژە چاکسازیەکەی عەبادی

لەگەڵ ڕاگەیاندنی پرۆژەی بڕیاری چاکسازی لەلایەن حەیدەر عەبادیەوە، تائێستا چەندین خوێندنەوە و لێکدانەوەی جیاواز بۆ ئامانجی پرۆژەکەو هەنگاو و لێکەوتەکانی کراوە، لێرەدا دەتوانین ئامانجەکانی پرۆژە چاکسازیەکەی عەبادی بەسەر دوو ئاستدا دابەش بکەین:

**ئاستی یەکەم**: لە بۆچونەکان بەو ئاراستەیە دەڕوات کە پرۆژەکەی عەبادی دورە لە ئامانجی چاکسازی، ئامانجی شاراوەو مەترسیداری بۆ ئایندەی عێراق لە ناوەڕۆکدا هەڵگرتووە، لە دیارترینیان بریتین لە:

1. بڕیارەکان کاردانەوەی ترسن لە تەشەنەکردنی خۆپیشاندانەکان، تا گەیشتن بە ئاستی دەرچون لە کۆنترۆڵی هێزە ئەمنیەکان و هێنانە ئارای توندوتیژی، دواتر بەکارهێنانی خۆپیشاندانەکان لەلایەن گروپە تیرۆریستیەکان، وەك ئەوەی لەساڵی 2013 لە ئەنبار و فەلوجە ڕوویداو خۆپیشاندانەکان بە سودو بەرژەوەندی داعش شکایەوە.
2. بڕیارەکان بۆ لێدان لەبەرژەوەندیەکانی ئەو بەرپرسانەی هەوڵی لاوازکردنی حەیدەر عەبادی دەدەن، بە دیاریکراوی باڵی (نوری مالیکی) لەناو حکومەت و هاوپەیمانی دەوڵەتی یاسا و حزبی دەعوەدا.
3. کپ کردن و هێورکردنەوەی دەنگی ناڕەزایی خۆپیشاندەران، ئەوەش بە تێپەڕکردنی کات و جێبەجێنەکردنی ئەو بڕیارە گرنگانەی کاریگەریان دەبێت لەسەر چارەسەرکردنی کێشە سەرەکیەکانی هاولاتیان. باشترین نمونەش بۆ ئەم دۆخە بریتییە لە جێبەجێنەکردنی چەند بەڵێنێك لە لایەن خودی عەبادییەوە کە لەماوەی ڕابردودا بە هاولاتیانی عێراقی داوە، لە دیارترینیان (بەڵێنی گرتنەوەی خێرای شاری ڕومادی بوو پاش داگیرکردنی لەلایەن داعشەوە، لەئێستادا زیاتر لە 3 مانگ بەسەر ئەو بەروارەدا تێپەڕیوە و عەبادی هیچ هەنگاوێکی جدی لەو بارەوە نەناوە. ئەوە جگە لە بەڵێندان بۆ هێرش کردنە سەر موسڵ و ئازادکردنی، کە تائێستا هیچ هەوڵێکی لەو شێوەیەش بۆ ئازادکردنەوەی موسڵ نەخراوەتە گەڕ...). ئەم جۆرە بەڵێنانەی عەبادی لە ڕابردودا وایکردوە هەندێك پێیان وابێ ئەم هەڵسوکەوتانەی عەبادی تەنها بۆ کپ کردنەوەی خۆپیشاندان و دروستکردنی جۆرێك لە بانگەشەی ئیعلامییەو دوای ماوەیەك بە تێپەڕینی کات کۆتاییان پێدێت.
4. عەبادی دەیەوێت لە ڕێگەی پشتگیری شەقامەوە هاوسەنگی هێز لە نێوان توانای حکومەت و هێزی گروپ و ملیشیا شیعیەکان بهێنێتە ئاراوە. بەو پێیەی لە ئێستادا هێزی گروپەکانی (حەشدی شەعبی) بەجۆرێك زیادی کردووە کە ئەگەر لەئاست سوپای عێراقدا نەبێت هیچی لەو کەمتر نییە.

5. ئامانجێکی دیکەی بریارەکان لەم ئاستەدا خۆی دەبینێتەوە لە خواستی بەهێزکردنی دەسەڵاتی ناوەند (المركزية) لەعێراق، ئەمەش ویستی پێکهاتەی شیعەیە لە عێراق، چونکە شیعەکان پێیان وایە عێراق تەنها بەناوەندگەرایی بەهێزدەبێت.

6. ئەو بریارانەی عەبادی کە تایبەتن بە لابردنی چەند پۆستێکی دیاریکراو لە حکومەتدا ناتوانێت 1٪ بودجەی عێراق بگەرێنێتەوە، چونکە گەندەڵی بە ئاستێکی بەرفراوان بەناو دامودەزگا گرنگەکانی دەوڵەتدا پەرش بونەتەوە، ئەو بەرنامە چاکسازییەی عەبادیش بە هەڵپەساردن و هەڵوەشاندنەوەی هەندێك پۆستی پلە باڵا ناتوانێت چارەسەری دۆخی عێراق بکات.

**ئاستی دووەم:** لەم ئاستەدا بۆچونەکان بەو ئاراستەیە دەرۆن کە (حەیدەر عەبادی) لە هەنگاوەکانیدا ئامانجی دروستی ئەنجامدانی چاکسازییە، بەو پێیەی بریارەکانی ئێستای عەبادی بەشێکن لەو بەرنامە سیاسیەی کە لەکاتی پێکهێنانی کابینەکەیدا بەڵێنی دابوو ئەنجامیان بدات. ئەوەبوو خۆپیشاندانەکانی ئەم دواییە ئەو هەلەیان بۆ عەبادی رەخساند تا لەژێر فشاری شەقام و رای گشتیدا بیٚ گوێدانە بەرژەوەندی چەند کەس و لایەنێك، هێزە سیاسیەکانی عێراق بەگشتی ناچار بکات مل بۆ چاکسازیەکان بدەن.

## چاکسازییەکانی عەبادی لەنێوان ئەمریکاو ئێراندا

وەك سەرجەم پرسەکانی دیکە ئەمجاریش ئەمریکاو ئێران وەك دوو هێزی کاریگەر لەسەر هاوکێشەی سیاسی عێراق، دەربارەی کارنامە چاکسازییەکەی عەبادی هەڵوێستی جیاواز و پێچەوانەیان هەیە. ئەمریکا بە فەرمی پشتیوانی خۆی بۆ پشتیوانیکردنی عەبادی راگەیاندوە، ئێرانیش بەهۆی دورخستنەوەی مالیکی لە دەسەڵات نیگەرانە لە هەنگاوەکانی عەبادی.

ئەمریکا لەچەند کاتێکی جیاوازدا پشتگیری خۆی دوپاتکردوەتەوە بۆ چاکسازی لە عێراقدا، سەرەتا جێگری سەرۆکی ئەمریکا (جۆ بایدن)، رایگەیاند: وڵاتەکەی پشتیوانی لەو چاکسازییانە دەکات کە حکومەتەکەی حەیدەر عەبادی سەرۆك وەزیرانی عێراق دەستی پێکردووە، بەتایبەتیش ئەو هەنگاوانەی کە پەیوەندیان بەچاکسازی ئابوورییەوە هەیە.

لە لایەکی دیکەوە (بریت ماکۆرك) یاریدەدەری وەزیری دەرەوەی ئەمریکا و نێردەی تایبەتی ئۆباما بۆ عێراق، پاش کۆبونەوەی لەگەڵ عەبادی، رایگەیاند: ئیدارەی کۆشکی سپی بە تەواویی تواناکانییەوە پشتیوانی لە چاکسازییەکانی کابینەکەی عەبادی دەکات و هۆکارێکیش دەبێت بۆ هەڵگرتنی کۆسپەکان لەبەردەم

جێبەجێکردنی چاکسازییەکاندا. تەنانەت ئەمریکا لەپاڵ هاوکاریکردنی سەربازی بۆ روبەروبونەوەی داعش، لە پێناو چارەسەری کردنی گرفتە خزمەتگوزارییەکان و بەرزکردنەوەی ئاستی ژیانی هاوڵاتیان لە عێراقدا و بەڵێنی گشت هاوکارییەکی بەخشیوەتە عەبادی.

بەم جۆرە دەستپێشخەرییەکانی ئەمریکا بۆ عەبادی تەواو ئێرانی نیگەران کردووە، ئێران ئەم هەنگاوانەی عەبادی بەسەرەتای گەرانەوەو هەیمەنەی ئەمریکا دادەنێت بۆ عێراق، بەتایبەت پاش دورخستنەوەی نزیکترین دۆستی ئێران لە دەسەڵات کە نوری مالیکی بوو. ئێران نایەوێت لەم قۆناغەدا دەستبەرداری مالیکی ببێت، سەرەرای دابەزینی پلەی پۆستە حکومیەکەی لەچاو جاراندا، بەڵام بۆ ئێران مالیکی سەرکردەیەکی خاوەن نفوزی سیاسییە.

لێرەوە خوێندنەوەی ئێران بۆ پرۆسەکەی عەبادی هێندەی وەك پاکتاو تەسفیەی سیاسی دەخوێندرێتەوە، هێندە وەك چاکسازی لێی ناروانرێت، چونکە بەرای ئێران چاکسازی ریشەیی کاتی زۆری پێویستەو لەم دۆخەی عێراقیشدا کارێکی زەحمەتە. بۆیە ئێران کارنامەی چاکسازییەکەی عەبادی وەك بەجێهێنانی ئەجێندای ئەمریکی دەخوێنێتەوە و هەوڵ بۆ پەکخستنی دەدات، بۆیە دور نییە ئێران فشارەکانی بۆ سەر عەبادی توندتر بکاتەوە، بەتایبەت لەرێگەی بەکارهێنانی گروپەکانی حەشدی شەعبی بەتایبەت ( رێکخراوی بەدر و عەسائیبی ئەهلی حەق و حیزب الله عێراقی ...)، کە لە ئێستادا رۆڵی سەربازی گرنگیان هەیە لە بەرەنگاری بونەوەی داعش. بۆ نمونە کشانەوەی حەشدی شەعبی لە چەند ناوچەیەکی پارێزگای ئەنبار، دەگوترێت بە ئاماژەی ئێران وەك فشارێك بەرامبەر عەبادی ئەم کارە ئەنجامدراوە.

لە لایەکی دیکەوە دیارترین ئاماژە لەبارەی بەکارهێنانی حەشدی شەعبی و کەسایەتیە دیارەکانی نێو ئەم هێزانە لە لایەن ئێرانەوە بۆ لێدان لە عەبادی، دەکرێت لە سەردانەکەی هەریەك لە (هادی عامری و مەهدی موهەندیس) بۆ لای (سەرۆکی ئەنجومەنی باڵای دادوەری) (مەدحەت مەحمود) ئەو نیەتە بخوێندرێتەوە، کاتێك کە هەریەك لە (عامری و موهەندیس) پاڵپشتی خۆیان دوپاتکردەوە بۆ رێگری کردن لە هەر دەستتێوەردانێك لە دەسەڵاتی دادوەری. ئەمە لە کاتێکدا (مەدحەت مەحمود) یەکێکە لە داواکراوەکان و تۆمەتبارە بەتێوەگلان لەچەندین دۆسیەی بەکارهێنانی دادگا بۆ بەرژەوەندی مالیکی لە رابردودا. ئەمەش ئاماژەیەکی دیکەی دەستتێوەردانی ئێرانە لەکاروبارەکانی عەبادی لەرێگای بەکارهێنانی حەشدی شەعبیەوە.

## ڕێگری و ئاستەنگەکانی بەردەم پرۆژەکەی عەبادی

سەرەرای بونی پشتگیری خۆپیشاندەران و مەرجەعیەتی باڵای شیعەو پاڵپشتی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق و سەرۆك کۆمار و پێشوازی لایەنە سیاسیەکان، بەڵام بە تێپەربونی کات چەند بەربەست و ئاستەنگێك روبەری پرۆژە چاکسازییەکەی عەبادی دەبێتەوە، لە دیارترینیان:

1. **گروپ و کەسە خاوەن بەرژەوەندییەکان (دەوڵەتی هاوتەریب)**

جێبەجێکردنی پرۆژە چاکسازییەکەی عەبادی سەرئەنجام بەرژەوەندی و ژیانی چەند کەسایەتییەکی سیاسی و ئابوری خاوەن پێگە لەناو دەوڵەتدا دەخاتە مەترسییەوە. ئەمەش واتە روبەروبونەوەی عەبادی دژ بە دیاردەی (دەوڵەتی هاوتەریب)[2]. کە ساڵانێکە بەتایبەت دوای روخاندنی رژێمی پێشوو لەناو دەسەڵاتی عێراقدا هەست بەئامادەدەی ئەم دیاردەیە دەکرێت. ئامانجی بەشدارانی نێو دەوڵەتی هاوتەریب خۆی لە لاوازکردن و لێدانی دەوڵەت دەبینێتەوە لەناو دەوڵەتەوە، ئەوەش لەپێناو بەرژەوەندی بەرتەسکی (کەسی و مەزهەبی و حیزبی ...)یاندا.

سەرئەنجامدا ئەم بڕیارانە سەرەتای کۆتای هاتنە بە هەژمونی سیاسی بەشێك لەسەرکردە سیاسیەکان، لەدەستگرتن بەسەر پۆستەکاندا، هەڕەشەش لەبونی سیاسیان دەکات لەئایندەدا، ئەگەر چی تا ئێستا گروپەکانی نێو دەوڵەتی هاوتەریب بێدەنگیان هەڵبژاردووە لە بەرامبەر توڕەیی شەقامدا، بەڵام ئاشکرایە سەرئەنجام لەکاتی جێبەجێکردنی بڕیارەکاندا ئاستەنگ دروست دەکەن، بەتایبەت لەرێگەی پەرلەمانەوە، لەلایەکی دیکەشەوە گەندەڵی و بەهەدەردانی سامانی گشتی لە عێراق هێندە رەگ و ریشەی بەناو قوڵایی

2. دەوڵەتی هاوتەریب (دەوڵەتی قوڵ) (الدولة العميقة): سەرەتای بەکارهێنانی ئەم زاراوەیە دەگەرێتەوە بۆ مێژوی سەددەی رابردو لە تورکیا، مەبەست لەم زاراوەیە بریتی یە لە دروست بونی کۆمەڵێك هێز و هاوپەیمانی و رێکخراو کۆمەڵە لەنێوان ئەو تاکانەی کە لەناو دەسەڵاتی دەوڵەتدا بەرپرسیاریان لەئەستۆدایە بەشێوەی ستونی و ئاسۆیی، ئەم هێزانە لەناو دەوڵەت و لە دەرەوەی دەوڵەتدا کۆمەڵێك پەیوەندی نا فەرمی بەرژەوەندییە تایبەتی و هاوبەشەکانیان. ئەم هێزانە هەوڵدەدەن سیاسەتی گشتی و بڕیارەکانی دەوڵەت بە ئاراستەی ئامانجەکانیان ئاراستە پێبگرن، ئەمەش لەرێگەی هەژمونی سیاسی و دروستکردنی تۆری پەیوەندی بەهێز لەناو پێکهاتە جیاوازەکانی دەسەڵاتی (یاسادانان و جێبەجێکردن و دادوەری و راگەیاند و دارایی ... )، تەنانەت دروست دەکەن، لەپێناو ئیدارەدانی کاردەگاتە سەر دەست گرتن بەسەر دامەزراوە ئەمنییەکانی دەوڵەتدا و بەکاریاندەهێنن لەساتەوەختی دروست بونی ناکۆکی و ململانێی سیاسیەکان لە بەرژەوەندی خۆیاندا.

دامەزراوەکاندا شۆڕ بۆتەوە، ئەستەمە بتوانرێت بە ئاسانی و کتوپڕی چارەسەری بکرێت. چونکە زۆرینەی دامودەزگا حکومیەکانی بەڕێوەبران و تەنانەت فەرمانبەرانیش بە دۆسیەکانی گەندەڵیەوە تێوەگلاون.

2. **ڕێکەوتنی سیاسی و توافوقی (تائیفی و نەتەوەیی)**

ئاشکرایە سروشتی پێکهێنانی حکومەتی عێراق لە ساڵی 2003 لەسەر بنەمای ڕێککەوتنی سیاسی (تائیفەگەری و نەتەوەیی) پێکهاتوە و بڕیاردان تێدا بە هاوبەشیە، دور نییە پرۆژەیەکی لەم شێوەیە ئەو بنەمایە لەریشەوە دەرنەهێنێت یاخود لاوازی بکات، چونکە لە ئێستادا هەنگاوەکانی عەبادی بە خۆسەپاندنی خواستی تائیفەی مەرجەعیەتی شیعە بەسەر (کورد و سونە)دا خوێندنەوەی بۆ دەکرێت.

بنەمای چاکسازیەکانی عەبادی خۆی دەبینێتەوە لە بەهێزکردنی دەسەڵاتی ناوەند، نەك بەهێزکردنی تەوافوق و هاوبەشی نێوان لایەنەکان. لەبەر ئەم هۆکارە لایەنەکانی دیکە جگە لە شیعەکان، ئەم هەنگاوانەی عەبادی بە هەرەشە بۆ بەرژەوەندیە تائیفی و مەزهەبی و نەتەوەیەکانیان دەزانن، لەبەر ئەمە دورنییە ئاستەنگ لە جێبەجێکردنیدا دروست نەکەن، بە تایبەتی (سونەکان).

ڕەهەندی سیاسی یەکێکە لە ڕەهەندە دیارەکانی نێو پرۆژەکەی عەبادی، چونکە دەستکاریکردنی پێنج پۆستی گرنگ لەم حکومەتەدا، وەك (جێگرانی سەرۆك وەزیران و جێگرانی سەرۆك کۆمار) کە بەپێی تەوافوق دابەشکراون، سەرئەنجام کاریگەری دەبێت لەسەر تەوافوقی لایەنەکان و دورنیە تەوافوقەکە ڕووەو هەڵوەشاندنەوە نەبات. ئەگەر بێت و تەواوی ئەو پۆستانەی کە لەسەر ئەو بنەمایە دابەشکراون بەبێ قەرەبوکردنەوەی لایەنەکان پێداچونەوەیان بۆ بکرێت، ئەوا ڕاستەوخۆ واتای کۆتای هێنانە بە بنەمای تەوافوق و هاوبەشی نیشتیمانی، لێرەشەوە گرفتی گەورەی سیاسی بۆ پێکهاتە و لایەنە سیاسییەکان دروست دەبێت. دوورنیە لە دەرئەنجامدا پرۆژەی هەڵوەشاندنەوەی حکومەت لە لای سەرجەم لایەنەکان نەکاتە کارتێکی کراوە.

3. **دابەشبونیماڵی شیعە و ململانێی نێوان حەوزەی عیلمی قوم و نەجەف**

یەکێکی تر لە ئەو ڕێگریانەی کە دوچاری پرۆژەکەی عەبادی دەبێتەوە، بریتییە لە دابەشبونی خودی پێکهاتەی شیعە بە سەر دوو بەرەدا، بەرەی یەکەمیان پشتگیری تەواوی هەنگاوە چاکسازیەکان دەکات ئەویش بریتیە لە (باڵی مەرجەعیەتی سیستانی و باڵی موقتەدا صەدر) لە نەجەف، بەرەی دووەمیش

پشتگیری سنورداری چاکسازییەکان دەکات، ئەم باڵەیان لە عێراق مالیکی بە ئاماژەی کۆماری ئیسلامی ئێران و حەوزەی عیلمی قوم هەنگاو هەڵدەنێت، لە ئێستادا ئەم گروپە پێگە و بەرژەوەندی گەورەیان لەنێو دامودەزگا مەدەنی و سەربازییەکانی دەوڵەت وەك (دادگا و سوپا و حەشدی شەعبی) عێراقدا هەیە.

لە ئێستادا بۆچونێك هەیە پێی وایە ئەو ئاڵۆزییە گەورەیەی رووبەروی هاوكێشەی سیاسی عیراق بوەتەوە، جەنگێکی شاراوەی نێوان (حەوزەی عیلمی قوم و حەوزەوی عیلمی نەجەف)ە. هەرچەندە تائێستاش بە شێوەیەکی ئاشکرا حەوزەی عیلمی قوم دژایەتی خۆی بۆ نەجەف رانەگەیاندوە، بەڵام حەوزەی عیلمی نەجەف نایەوێت راستەوخۆ لە ژێر کاریگەری و بریاری حەوزەی قومدا بێت، ئەم مەبەستەش لە بریاری پشتیوانیکردن لە عەبادی بۆ چاکسازی رەنگیدایەوە، لە کاتێکدا حەوزەی قوم لەم قۆناغەدا دژی لاوازکردنی مالیکی و لایەنگرانیەتی لە عێراق، هاوکات نایەوێت پەیوەندییەکانی بەغدا لەگەڵ تاران روەو لاواز بون بچێت و ئەمریکا ئەم بابەتە بەسودی خۆی بەکاربهێنێت.

## 4. کێشە ناوخۆییەکانی نێو حیزبی دەعوە و ململانێی نێوان مالیکی و عەبادی

کەڵەکەبونی کێشە ناوخۆییەکانی حیزبی دەعوە بەتایبەت پاش پرۆسە چاکسازییەکی عەبادی، دور نییە جارێکی دیکە (حیزبی دەعوە) رووبەڕووی جیابوونەوەی گەورە بکات. بەتایبەتی لەپاش تۆمەتبارکردنی نوری مالکی سەرۆك وەزیرانی پێشوو لەلایەن لیژنەی پەرلەمانی عیراقەوە، بە دۆسیەی کەوتنی شاری موسڵ، کە مالیکی لای خۆیەوە رەتیکردەوە و ئەو بابەتی بەدۆسیەی سیاسی نەیارەکانی ناوبرد. بریارەکانی ئەم دوایەی عەبادی فشارێکی زۆر گەورەی بۆ خودی عەبادی دروستکردوە بەتایبەت لەنێو ئەندامانی حزبەکەیدایە، لەپاش بریاری هەڵوەشاندنەوەی پۆستەکەی نوری مالکی.

بۆچونێك هەیە پێی وایە عەبادی هەر لەپاش دورستکردنی کابینەی نوێی حکومەتەکەی، پلانی بۆ دورخستنەوەی مالیکی و باڵەکەی لەنێو حکومەت بەئامانج گرتبو، خۆپیشاندانەکانی ئەم دوایەش باشترین دەرفەت بو بۆ عەبادی تاوەکو ئەو پرۆژەیە جێبەجیێ بکات.

بەم جۆرە لە ئێستادا ململانێکانی نێوان (حەیدەر عەبادی و نوری مالکی) لەنێو حیزبی دەعوە و حکومەت تۆختربوەتەوە، تەنانەت کارگەیشتوەتە ئەوەی مالیکی سەرەرای هەڵوەشاندنەوەی پۆستەکەی، بەڵام بەردەوام بێت لە نمایشکردنی هێزی شەخسی و کاریگەری لە عێراقدا، باشترین نمونەش لەم بارەیەوە بریتی بوو لە بریاری گەرانەوەی لە ئێرانەوە بۆ بەغدا، پاش تۆمەتبارکردنی بە دۆسیەی تێوەگلانی لە کەوتنی

شاری موسڵ، ئەوەبوو لە فرۆکەخانەی بەغدا لە لایەن جەماوەرێکی زۆرەوە پێشوازی لێکرا، ئامانج لەم هەنگاوەش بریتی بوو لە نمایشکردنی هێزو پێگەی جەماوەری خۆی بۆ عەبادی و لایەنە نارازییەکانی ناو حزبی دەعوە.

قوڵبونەوەی ململانێکانی نێوان مالیکی و عەبادی لە نێو خۆی حزبەکەیاندا گەشتوەتە ئاستێك، کە لە ئێستادا باس لە جیابونەوەی عەبادی و هاوبیرەکانی دەکرێت لە حیزبی دەعوە، بەڵام سەرچاوەیەکی نزیك لە عەبادی رایگەیاندووە عەبادی بەهیچ شێوەیەك بیر لەجیابوونەوە و دروستکردنی فراکسیۆنێکی نوێ ناکاتەوە.

لە لایەکی دیکەوە بۆچونێکی دیکە هەیە پێی وایە (نوری مالیکی) بەو ئاسانییە خۆی رادەستی بریارەکانی عەبادی ناکات هەوڵدەدات لەرێگەی دروستکردنی ئاژاوەو نانەوەی پشێوی ئەمنی و قوڵکردنەوەی ناکۆکییە تائیفییەکان، هەوڵبدات بۆ لاوازکردنی حکومەتەکەی عەبادی بەئامانجی هەڵوەشاندنەوەی.

5. **نادەستوری و نایاسای بونی هەنگاوەکانی عەبادی**

ئەگەر بروانینە کارنامەی چاکسازی و بڕیارەکانی عەبادی، دەبینین بەشێك لە هەنگاوەکانی سنوری دەسەڵاتەکانی سەرۆك وەزیرانی تێپەراندوە و دەست تێوەردانی کردووە لەدەسەڵاتی دامەزراوەکانی دیکەدا، ئەمەش راستەوخۆ پێچەوانەی ماددەی 47 دەستوری عێراقە، کە جەخت لەوە دەکاتەوە دەسەڵاتی فیدراڵی ئەرکەکانی خۆی لەسەر بنەمای لێکجیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان پیادە دەکات.

خودی عەبادی لەماوەی رابردودا ئەوەی نەشاردۆتەوە کە رێگری دەستوری لەبەردەم چاکسازیەکانیدا هەیە، چونکە هەر گۆرانکارییەکی بونیادی لەئاستی پێکهاتەی سیاسیدا پێویستی بە گۆڕانکاری دەستوری هەیە. لەم قۆناغەشدا هەندێك مادەو بەندی دەستوری دەستی عەبادییان گرتوە و رێگر دەبن لەبەردەم بەخێرایی راپەراندنی پرۆژەکەیدا، لێرەدا هەندێك لەو برگەو ماددە دەستوریانە دەخەینە روو، لە دیارترین ماددە دەستورییەکانیش بریتین لە:

**ماددەی69:** سەرۆك کۆمار جێگرێك یان زیاتری دەبێت و بەیاسا رێك دەخرێن، واتە سەرۆك وەزیران دەسەڵاتی لابردنیانی نییە، چونکە ئەو بابەتە خراوەتە چوارچێوەی دەسەڵاتی سەرۆك کۆمارو ئەنجومەنی نوێنەران بەپێی یاسا.

**مادەی 78:** سەرۆك وەزیران دەسەڵاتی لەکارخستنی وەزیرەکانی هەیە بەڵام ناتوانێت بەبێ ڕەزامەندی ئەنجومەنی نوێنەران لەکاریان لابدات، بەڵام عەبادی هەستا بە هەڵوەشاندنەوەی چەند وەزارەتێك و تێکەڵکردنەوەی چەند وەزارەتێکی دیکە بەبێ گەرانەوە بۆ ئەنجومەنی نوێنەران.

**ماددەی 80:** ئەم ماددەیە لە 6 برگە پێك هاتووەو پەیوەندیدارە بە دەسەڵاتەکانی ئەنجومەنی وەزیرانەوە، بۆیە دەکرێت راستەوخۆ دوای ڕەزامەندی ئەنجومەنی وەزیران جێبەجێبکرێن، لەوانە کەمکردنەوەی ئیمتیازات و دەرماڵەو پاسەوانی بەرپرسان و دروستکردنی لیژنەی لێپرسینەوە و بەدواداچون .

6. **شکاندنەوەی چاکسازییەکان لە بەرژەوەندی تائیفەی شیعە**

دوابەدوای ئەو تەنگەژە سیاسی و ئەمنیانەی حکومەتەکەی مالیکی لە دوای ساڵی 2012 دوچاری هات، بژاردەی حکومەتی زۆرینە بو بەباسی هێزە شیعەکان، چونکە بڕوایان وابو حکومەتی عێراقی لەبەر ئەوەی لەسەر بنەمای بەشکاری تائیفی و نەتەوەیی دروستکراوە، حکومەتێکی لاوازە، لەبەر ئەم خاڵەش ناتوانێت تا کۆتای وەڵام دەرەوەی داخوازییەکانی هاوڵاتیان بێت و قەیران و کێشەکانی ماوەی رابردو چارەسەر بکات.

لەبەرامبەردا هێزە سونەکان هەمیشە کارتی هەرێمی سەربەخۆ و دابەشکردنی عێراق وەك کاردانەوەیەك بۆ هەڵوێستی پەراوێزخستنی سونە لە جومگە سەرەکیەکانی حکومەت بەکار دەهێنن. ئەمە جگە لە نارِەزایەتی هەرێمی کوردستان و هێزە نێودەوڵەتی و هەرێمییەکان، کە هەمیشە رێگر بون لە بەردەم کۆبونەوەی دەسەڵات لەدەستی یەك تائیفە لە عێراق، ئەگەر بەشێوەیەکی شکڵیش بووبێت.

ئەوەی رونە ئەم پرۆژە چاکسازییەی عەبادی بەجۆرێك لە جۆرەکان جێگرەوەی حکومەتی زۆرینەیە، ئەویش لە رێگەی کۆکردنەوەی دەسەڵات لەدەستی سەرۆك وەزیران، لە نمونەی دەسەڵاتی لادانی پارێزگار و ئەندامانی ئەنجومەنی پارێزگاکان. هەروەها هەڵوەشانەوەی پۆستی جێگرانی سەرۆك وەزیران و سەرۆك کۆمار، دانانی پۆستی پلە تایبەتەکان و دەستە سەربەخۆکان دور لە بنەمای ئیستحقاقی پێکهاتەکانی عێراق.

عەبادی و مەرجەعیەتی شیعە لەم هەنگاوەدا سودیان لە نارەزایەتیەکانی شەقام وەرگرت بۆ وەرگرتنی ئەم دەسەڵاتانە و بەکارهێنانیان بۆ هەندێك مەبەست و بەرژەوەندی دیاریکراو، تەنانەت کار گەیشتە ئەوەی پشتیوانی کورد و سونە لە پەرلەمان بۆ پرۆژەکەی عەبادی بەدەست بخەن، ئەمە لە کاتێکدا هێزە شیعەکان لەسەردەمی مالکیدا چەندین هەوڵیاندا بۆ چرکردنەوەی دەسەڵاتەکان لە دەستی مالیکی دا، بەڵام شکستیان

هێناو لایەنی سونەو کورد لەدژیان وەستانەوە. ئەمە بۆ وڵاتێکی دیموکراسی ئاساییە، بەڵام لە وڵاتێك کە هێشتا بنەمای هاوڵاتی بون و متمانە لە نێوان پێکهاتەکانیدا نەهاتوەتە ئاراوە، هەرەشەیەکی گەورەیە بۆ سەپاندنی بەرژەوەندی مەزهەب وتائیفیەك بەسەر پێکهاتەکانی دیکەدا.

سەرەرای ئەوەی ماڵی شیعە لەبارەی پرۆژەکەی عەبادیەوە کەرتبونی پێوە دیارە، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی هێزە شیعیەکان و مەرجەعی شیعیەکان پشتگیری دەکەن، تەنها رەخنەیەکیش هەیان بێت، شێوازی پیادەکردنی بەشێکی پرۆسەکەیە، هەربۆیە لە ئێستادا عەبادی رەچاوی ئەو رەخنانەی هێزە شیعیەکانی کردوە، بەتایبەت لە بەئامانج نەکردنی مالیکی لەم دوایانەدا.

لەلایەکی دیکەوە پرۆژە چاکسازییەکەی عەبادی تا ئێستا شۆڕنەبوەتەوە بۆ ئاستی چاکسازی لەسوپاو هێزی سەربازیدا، چونکە ئەوەی نەشاراوەیە لەعێراقدا ئەو راستیەیە کە بەهۆی لاوازی هێزە سەربازییە فەرمییەکان، میلیشیای چەکداری هێزە شیعیەکان ئەم کایە گرنگەیان بۆ خۆیان قۆرغکردوە و بونەتە جێگرەوەی سوپا و لە بەرەکانی جەنگدا ئەوان فەرمان بە سوپای عێراق دەکەن. هەربۆیە لە ئێستادا پێکهاتەکانی تری عێراق ترسی ئەوەیان هەیە ئەم هێزە ملیشیایە چەکدارانەی عێراق وەك هاوشێوەی (حرس الثوری) ئێرانی لێبکرێت، بەمەش پرۆسە ناوەندگەراییەکەی هێزە شیعیەکان لە عێراق زەمینەی هاتنە ئارای بەهێزتر دەبێت.

### 7. بەردەوامبونی خۆپیشاندانەکان

سەرەڕای ئەوەی پرۆژە چاکسازیەکەی عەبادی و پاشان ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق بوون بە بریار، بەڵام خۆپیشاندانەکان لە پایتەخت و شارەکانی باشور بەردەوامیان هەیە، بە پاساوی چاودێری جێبەجێکردنی پرۆژەکانی چاکسازیەکان، ئەم بەردەوامیە ترسی دروستبونی توندوتیژی و چاوەروانی لێکەوتەی نێگەتیڤی لێدەکرێت، چ لەلایەن گروپ و کەسە خاوەن بەرژەوەندیەکان بێت، یاخود لە لایەن گروپ و رێکخراوە تیرۆریستیەکان بەتایبەت (داعش). ئەمەش بۆخۆی دەبێتە رێگرییەکی دیکە لەبەردەم خاوکردنەوەی هەنگاوەکان، یاخود جێبەجێ نەکردنی پرۆژەکەی عەبادیدا.

لەم بارەیەوە رۆژی 20ی ئابی 2015 نوری مالیکی سەرۆك وەزیرانی پێشوی عێراق لە چاوپیکەوتنێکی کەناڵی ئەلعێراقیە ترسی خۆی لەوە نەشاردەوە بەردەوامی خۆپیشاندانەکان هەمان دۆخی خۆپیشاندانەکانی

ساڵی 2012ی ئەنباری بەسەردابێت، بەو پێیەی ئەو ڕێکخراوە ئاراستەی خۆپیشاندانەکانی گۆڕی و لە بەرژەوەندی خۆی بەکاریهێنا.

هەروەها نوێنەری (سیستانی) گەورە مەرجەعی شیعەکان لە گوتاری هەینی 21ی ئابی 2015 داوای لە خۆپیشاندەران کرد دەرفەت بدەن بە حکومەت چونکە ئەو چاکسازیانە کاتی دەوێت، ئەمەش لە پێناو کۆتایی هێنان بوو بە خۆپیشاندانەکان، بەڵام بە پێچەوانەی ئەم داوایە ئێوارەی هەمان ڕۆژ خۆپیشاندەران چونە شوێنەکانی خۆپیشاندان لە شاری بەغداد و شارەکانی تری باشوری عێراق و بەردەوامیان دا بە هەڵوێستەکانیان، تا ئێستاش بەردەوامن لە دەربرینی نارەزایەتی و خۆپیشاندان بەرێگای ئاشتیانە.

**ناوەندگەرایی و حوکمڕانی زۆرینە لەعێراق**

بیرۆکەی بەهێزکردنی ناوەندگەرایی، پرۆژەیەکی ئامانجداری ئەو حکومەتانە بووە کە ئیدارەی عێراقیان داوە، دیاریترنیان رژێمەکەی سەردەمی (صەدام حسێن) بوو، صەدام حسێن پرۆژەی ناوەندگەرایی و قۆرغکردنی دەسەڵاتی بە میکانیزمی بەکارهێنانی هێزی سەربازی سەپاند، بەڵام لە بەرامبەریشدا روبەروی بەرپەرچدانەوەی چەکداری بویەوە، لە بەرئەمەش تا سەر نەیتوانی پرۆژەی ناوەندگەرایی لە عێراق بچەسپێنێت.

لەپاش کۆتای هاتنی فەرمانرەوایی (صەدام حسێن) لە ساڵی 2003، هێزە ئۆپۆزسیونەکانی عێراق لەسەر بنەمای هاوبەشی و پەیرەوکردنی ناناوەندی(لامەرکەزی) ئیداری و چەسپاندنی فیدراڵیەت دەستوری عێراقیان دارشتەوە، هێزە شیعیەکان و کورد پاڵپشتی سەرەکی و دارێژەری ئەو بنەمایە بوون، بەڵام هێزە سونیەکان تا ئەوکاتەش پشتگیری ناوەندگەرایان لە عێراق دەکرد، بەڵام بەهۆی باڵا دەستبونی هێزە شیعیەکان ئەم روانینەی هێزە سونیەکان گۆڕدراو بوون بە بەشێك لە پشتیوانانی پرۆژەی نا ناوەندێتی لە عێراق، لە بەرامبەردا بە پێچەوانەوە تێروانینی هێزە شیعیەکان گۆڕدرا بۆ پشتگیری کردن لە پرۆژەی ناوەندگەرایی لە عێراقدا.

شیعەکان پێیان وایە عێراقی بەهێز تەنها لەو دۆخەدا دێتە ئاراوە کە لە پایتەختی وڵاتەوە بە ناوەندگەرایەکی بەهێز ئیدارە بکرێت. بۆ جێبەجێکردنی ئەم پرۆژەیەش هێزە شیعیەکان تاکو ئێستا بەردەوامن لەسەر ئەم پرۆژەیان، یەکەم هەنگاویش مالیکی لە کابینەی دووەمی حوکمرانیەکەی دەستی پێکرد، بەشێك لە چاودێران ئەم چاکسازیانەی عەبادی بە بەشێك یاخود بە تەواوکاری هەمان پرۆسەیە هەژمار دەکەن، بۆ تێگەیشتن لەم پرۆسەیە باس لە دوو قۆناغی پرۆسەی ناوەندگەرایی هێزە شیعیەکان دەکەین لە عێراقدا:

**قۆناغی یەکەم/ پرۆسەی توندی ناوەندگەرایی**

بیرۆکەی بەهێزکردنی ناوەندگەرایی و حکومەتی زۆرینە لە عێراقدا، پرۆژەیەکی ئامانجداری پێکهاتەی شیعەیە، بە تایبەت لەدوای سەرهەڵدانی ناڕەزایەتیەکانی ناوچە سونیەکان لە دوای کشانەوەی هێزەکانی ئەمریکا لە عێراق، لە کۆتایی ساڵی 2011. پرۆژەی ناوەندگەرایی بەڕونی لەخولی دووەمی کابینەکەی (مالیکی) بەدەرکەوت، بەشێوەیەك ئەنجومەنی پارێزگاکان و پارێزگارەکان ڕێگریان لێدەکرا بۆ جێبەجێکردنی کارەکانیان، سەرەرای ئەوەی دەسەڵاتی یاسایان هەبوو. ئەمەش نارەزایەتی پارێزگا سونیەکانی بەدوای خۆیدا هێنا، لە سەرەتاکانی ساڵی 2012، لە ژێر ناوی دابەشکردنی دەسەڵات و ڕێگری نەکردن لە بەکارهێنانی دەسەڵات لە لایەن حکومەتی خۆجێی پارێزگاکان.

ئەوەی جێگەی ئاماژە پێکردنە کابینەکەی (مالیکی) نەك گوێی بۆ ئەو داوایانە نەدا بەڵکو بەتوندی بەرپەرچی دایەوە، هەروەها وەك پەرچەکە کردارێك بەرامبەر ئەو ناڕەزایەتیانە تێکچونی دۆخی سیاسی عێراق بیرۆکەی حکومەتی زۆرینەی گەلاڵەکرد، بەو پاساوەی تاکە چارەسەر بۆ دۆخی عێراق حکومەتی زۆرینەو بەهێزکردنی ناوەندگەراییە. ئەوەی جێی ئاماژەیە پرۆژەی دروستکردنی حکومەتی زۆرینە توشی بەرپەرچدانەوەی توندی نێوخۆیی بویەوە، هەربۆیە ئەم بیرۆکەیە وەستێنرا، بەڵام بیرۆکەی بەهێزکردنی ناوەندگەرایی سەرەڕای ئەوەی لە ڕوی تیۆرییەوە نەتوانرا پاڵپشتی بۆ پەیدا بکرێت، بەڵام لە ڕوی پراکتیکیەوە زۆر بە توندوتۆڵی جێبەجێکرا، ئەمەش وای کرد حکومەتە خۆجێیەکان لە پارێزگاکان دوچاری جۆرێك لە ئیفلیجی و بێ دەسەڵاتی بێنەوە.

سەر ئەنجام پراکتیزەکردنی سیاسەتی ناوەندگەرایی لە لایەن (نوری مالیکی) لە خولی دووەمی کابینەکەیدا، هۆکار بوو بۆ ئەوەی پێکهاتەی سونە و کورد لە خولی دواتردا پێداگری بکەن لەسەر نەبەخشینی متمانە بە مالیکی بۆ خولی سێیەمی کابینەی حوکمرانی لە عێراقدا.

**دووەم / پرۆسەی نەرمی ناوەندگەرایی**

ئەگەر بەوردی تەماشایی پرۆژە چاکسازیەکەی عەبادی بکەین لە ڕوانگەی بەهێزکردنی ناوەندگەرایی، ویستێکی ناوەندگەرایی کۆکردنەوەی بڕیاردان لە خودی سەرۆك وەزیران و هەڵسوکەوتەکانیدا بەدی دەکرێت. ئەم ویستە لەژێر فشاری خۆپیشاندەران بەیاساکرا، بەبێ ئەوەی هیچ هێزێکی سیاسی لە ئەنجومەنی نوێنەران ناڕەزایەتی لە دژی دەربڕبرێت، ئەمەش لەپێناو نەبێزراوی پارتەکەیان لە بەردەم خۆپیشاندەران و ڕای گشتی عێراقدا.

بەم دوایانە (عەبادی) بە تایبەت لە دوو بۆنەی جیاوازدا ویستی ناوەندگەرایی و کۆکردنەوەی بریارەکان لەدەستی خۆیدا ئاماژەی بۆ کردووە، ئەوەش لە رێگەی بەکارهێنانی تورەی شەقامی نارازی بۆ خواستەکانی. سەرەتا لە رێکەوتی 12ی ئاب لە بۆنەی رۆژی جیهانی گەنجان، دواتر لەرێکەوتی 26ی ئاب لە چاوپێکەوتنێکی ئامادەکراودا لەگەڵ ژمارەیەك لە پەرلەمانتاران و رۆژنامەنوسان، ئاماژەی بۆ ئەم بابەتە کرد. بەجۆرێك باسی لەوە کرد کە ئەگەر بێت و خۆپیشاندەران دەسەڵاتی پێ ببەخشن و پشتیوانی گشتی پێبدەن، ئەوا سەرۆك وەزیران سەڵاحیەتی راگەیاندنی باری نائاسایی دەبێت و دەتوانێت دەستوریش هەڵبوەشێنێتەوە.

ئەوەی جێگەی تێرامانە ئەوەیە کە ئەم دیدگایە هەمان ویستی (مالیکی)یە، کە لە خولی دووەمی کابینەکەی هەوڵی بۆدا، بەڵام شێوازی پەیرەوکردنەکەیان جیاوازە. بۆنمونە عەبادی دەیەوێت عێراق بگەڕێنتەوە بۆ ناوەندگەرایی، بەڵام بەشێوازێکی نەرم ئەویش بەکارهێنانی نارەزایەتیەکانی خۆپیشاندەران بۆ ئەم مەبەستە، واتە تا ئاستێك بەرێگایەکی یاسایی هەوڵ بۆ دەستخستنی ئەم ئامانجە دەدات. لە دەرئەنجامیشدا تا ئێستا توانیویەتی بەسەرکەوتویی رەهەندی یاسایی بۆ هەنگاوەکانی بەدەست بهێنێت. بەڵام لە کۆتایدا ئەم هەنگاوەی عەبادی بۆ ناوەندگەرایی خۆی دەبنێتەوە لە بەهێزکردنی ماڵی شیعە، لە بەرامبەردا لێدانە لە پرەنسیپی تەوافوق و دابەشکردنەوەی دەسەڵاتەکان، بەڵام بە شێوەیەکی نەرم. لەکاتێکدایە پێکهاتەی دیمۆگراف عێراق لە دوای ساڵی 2003 لەسەر بنەمای فرە پێکهاتەیی و هاوبەشی لە بەرێوەبردنی عێراق کۆبونەتەوە، هەروەها دەستوری ساڵی 2005 لەسەر هەمان بنەما دارێژراوە.

## مەترسی هەنگاوە چاکسازییەکانی عەبادی

سەرەڕای ئەوەی ئەم چاکسازیانەی عەبادی رۆڵی هەبووە لە رێگری کردن لە بەهەدەردانی داهاتی گشتی بە کەمکردنەوەی پۆستە باڵاکان و وەزارەتەکان، چەندین رێکاری دیکە، کە ئەگەر بەردەوام بن کاریگەریان دەبێت لەسەر دۆخی گوزەران و ژیانی هاوڵاتیان، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا چەندین مەترسی لە بەکارهێنانی ئەم چاکسازیانە هەیە بۆ خواست و ئامانجی دیکە، لەوانەش:

مالکی لە دووەم خولی کابینەکەیدا هەوڵی بەهێزکردنی ناوەندگەرایی توند بوو لە عێراق، بەڵام دوچاری بەرپەرچدانەوە و پەرچەکردار بوو، ئێستا عەبادی هەمان سیاسەت پەیرەودەکات بە شێوازی ناوەندگەرایی نەرم، بەڵام لەژێر فشاری خۆپیشاندەران هێزەکانی دیکەی ناچارکردووە، هەنگاوەکانی بەیاسای بکەن، ئەوەش لەرێگەی ئەنجومەنی نوێنەران لەژێر ناوی چاکسازیدا.

1. هەوڵێك بۆ كەمكردنەوەی ئاستی فشار و نارەزایەتی و خۆپێشاندەران و رێگری لە گواستنەوەی بەرەو دۆخی پێكدادان و توندوتیژی، وەك چۆن لە سەرەتاكانی ساڵی 2013 لە پارێزگاكانی ناوەراست و رۆژئاوای عێراقی گرتەوە، لەنمونەی خۆپیشاندانەكانی پارێزگای ئەنبار.
2. گومانی ئەوە دەكرێت ئامانجی راستەقینەی بریارەكانی حەیدەر عەبادی زیاتر لەوەی چاكسازی راستەقینە بێت، هەوڵێك بێت بۆ دوبارە سەپاندنەوەی هەیمەنەی شیعە بەسەر سیاسەتی حكومەتی عێراقدا، بەتایبەت لەرێگەی جێبەجێكردنی راستەوخۆی پەیامەكانی مەرجەعیەتەوە، خودی (سیستانی) بۆ ئەم مەبەستە داوا لە عەبادی دەكات كە هەرچی زووە پەلە بكات لە جێبەجێكردنی پاكێجەكانی چاكسازی لە حكومەتەكەیدا، ئەگەر نا عێراق روبەروی مەترسی لێك هەڵوەشاندنەوە دەبێتەوە.
3. دوای داگیرساندنی گڵۆپی سەوزی مەرجەعیەتی شیعەكان، عەبادی زۆر بەپەلە دەستی كرد بەبریار دەركردن و جێبەجێكردنی بریارەكانی، سەرەرای پشتیوانی كوردو سونە بۆ هەنگاوەكانی چاكسازی بەڵام جۆرێك لە نیگەرانی بەدوای خۆیدا هێناوە، بەو پێیەی كە لە ئێستادا لایەنەكان نازانن كێیە حكومەت عێراقی بەرێوە دەبات و سیاسەتی گشتی دادەرێژرێت، دەزگاو دامەزراوەی دیموكراسی و دەستوریەكانن، یاخود مەرجەعیەتی باڵای شیعە.
4. لەپاڵ هەنگاوەكانی چاكسازیدا ئەگەر هەیە ئاستی ململانێ حیزبیەكان توند تر ببێتەوە، وەك دەگوترێت عەبادی مەبەستیەتی بەناوی چاكسازی لە حكومەتدا نەیارەكانی لە دەسەڵات دور بخاتەوە و تاك لایەنانە عێراق بەرێوە ببات. بەتایبەت (نوری مالیكی) كە لەماوەی رابردودا توانیویەتی هەژمون و پێگەی لە نێو پارتەكەیدا بقۆزێتەوە بۆ بچوكردنەوەو لاوازكردنی رۆڵی عەبادی وەك سەرۆك وەزیرانی عێراق.
5. لەژێر ناوی چاكسازی و دۆخی نا ئاساییدا عەبادی پێشێلی دەستور دەكات و دەست وەردەداتە نێو دەسەڵاتەكانی (یاسادانان و دادوەری و دەستە سەربەخۆكان)، ئەمەش واتای لاوازكردنی دەسەڵاتی پەرلەمان و بەهێزكردنی دەسەڵاتی تاكرەوی ناوەندی (مەركەزی).

**لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا دەتوانین بڵێین دواجار لە بریارە چاكسازییەكانی عەبادی چاوەروانی رودانی چەند ئەگەرو پێشهاتێك دەكرێت لە دیارترینیشیان:**

**1. دابەشبونی عێراق و توندبونەوەی گرژی لایەنەكان**

هەنگاوە چاکسازییەکانی عەبادی لە پێگە و بەرژەوەندی سیاسی و ئابوری چەند کەسایەتییەك دەدات، لەسەرجەم پێکهاتەکانی عێراق، ئەمەش بۆی هەیە ئاستی ململانێ و توند و تیژییەکان زیاتر بکاتەوە، لە بەرامبەردا لایەنەکان هەوڵدەدەن تۆڵەی خۆیان بکەنەوە، لەبەرئەمەش تا ئاستی چاکسازییەکان بەرفراوانبێت و زیاتر پێگەی کوتلەیەك بۆ کوتلەیەکی تر بگرێتەوە ، یاخود لە کەمینەیەکەوە بۆ زۆرینەو بە پێچەوانەوە بێت، سەرئەنجام هەنگاوەکان بە ئاراستەی لێك ترازاندن دەچێت لەنێوان پێکهاتەکان و کوتلەکاندا، لێرەشەوە ئەگەری ئەوە هەیە عێراق بەرەو هەڵوەشانەوە دابەشبوون بچێت و نزیك بێتەوە لە لێواری روخاندن. ئەمەش ئەو پێشهاتە مەترسیدارەیە کە مەرجەعە باڵای شیعە لە عێراق (سیستانی) هۆشداری لەبارەیەوە داوە.

2. **سەرکەوتنی چاکسازی**

ئەوەی جێگەی ئومێدە لەم هەنگاوە چاکسازیانەی عەبادی بریتییە لە دەستبردن و لێپێچینەوە لە گەندەڵکاران و گێڕانەوەی داهاتی بەهەدەردراوی وڵات بۆ خەزێنەی گشتی، لە پێناو بەدیهێنانی گۆرانکاری گشتی و بەدیهێنانی چاکسازی لەتەواوی بوارەکاندا. بەواتایەکی دیکە ئەوەی ئەم هەنگاوانەی عەبادی لەوانەی پێش خۆی جیا دەکاتەوە بریتیە لە بریاردان بۆ ئەنجامدانی چاکسازی بەرێگەی ستونی (لەسەرەوە بۆ خوارەوە). لە لایەکی دیکەوە سەرەتای هەنگاوەکانی عەبادی بەچاکسازی سیاسی دەستپێکرد، تاوەکو لەم رێگەیەوە بتوانێ دەروازەیەك بکاتەوە بۆ ئەنجامدانی چاکسازی و گەشەپێدانی گشتی لە تەواوی سێکەتەرەکانی دیکەی وەك ( ئابوری، خزمەتگوزاری، دادوەری، ئەمنی، کارگێری ... هتد). بەواتا تاوەکو چاکسازی سیاسی لەتەواوی جومگە هەستیارەکانی دەوڵەتداریدا ئەنجام نەدرێت ناتوانرێت باس لەچاکسازی گشتی بکرێت لە سێکتەرەکانی دیکەدا.

3. **گێراندنەوەی ناوەندگەرایی و زیادبونی رۆڵی مەرجەعی شیعە**

ئەم پێشهاتە وەك یەکێك لە ئەگەرە چاوەروانکراوەکان باسی لەبارەوە دەکرێت، بەو پێیەی عەبادی دەبێتە تەواوکاری ئەو هەنگاوانەی کە مالیکی لەرابردودا پلانی بۆ دارشتبون، لەوەش زیاتر بریتییە لەزیادبونی رۆڵی مەرجەع و خودی سیستانی لەم نێوانەدا، بەتایبەت لە بریارەکانی عەبادیدا بەرونی ئەوە دەردەکەوێت کە عەبادی بە پاڵپشتی پشتیوانیەکانی مەرجەعی باڵا ئەو رێوشوێنانە دەگرێتە بەر. ئەوەش راستەوخۆ واتای زیادبونی رۆڵی مەرجە بەسەر کایەی سیاسی و حکومرانی عێراقەوە، بەو پێیەی چیتر بریارێك لە عێراقدا دەرناچێت ئەگەر بێت و خودی مەرجەع و سیستانی رەزامەندیان نەبێت لە بارەیەوە.

**4. بەردەوامبوونی دۆخەکە وەك خۆی**

زۆرێك بروایان وایە ئەو رێوشوێنانەی کە عەبادی گرتویەتیەبەر  تەنها کوشتنی کات و ماندوکردنی شەقام بەدوای خۆیدا دەهێنێت، چونکە لە بنەمادا بریارەکانی عەبادی زۆر لەپێگەی سیاسی و یاسای خۆی گەورەترن، بۆیە دور نییە لەکۆتاییدا سەرجەمی ئەو بریارانە، وەك گشت هەنگاوەکانی رابردو تەنها بە مەرەکەبی سەر کاغەز (حبر علی الورق) بمێننەوە و هیچ گۆرانکارییەکی جدی بەدوای خۆیاندا نەهێنێتە گۆرێ.

## راسپاردەکان بۆ نوێنەرانی کورد لە بەغداد

هەر قسەکردنێك لەبارەی چاکسازیەوە لە دەرەوەی چوارچێوەی دەستورو یاسا کارپێکراوەکاندا، کودەتاییەکی تر دەبێت بەسەر دەستور و سیستەمی سیاسی عێراقدا و لەوێشەوە مەترسیەکی جدی دەبێت بۆ سەر ئاسایش و ئارامی عێراق بە گشتی و بۆ هەرێمی کوردستان و مافە دەستوریەکانی لەعێراقدا بەتایبەتی، بۆیە پێویستە نوێنەرانی کورد پەیامی ئاشکراو رونیان هەبێت، پێداگری لە ئیستحقاقی هەرێمی کوردستان بکەن و سڵ لە پاراستنی بنەماکانی فیدراڵی و ناناوەندی لە عێراق نەکەنەوە، بۆ ئەو مەبەستەش دەکرێت ئەم راسپاردانەی لای خوارەوە بکرێنە بنەماو لە کارکردنیاندا پشتی پێ ببەستن:

1. پشتگیری هەموو جۆرە چاکسازیەك بکرێت، کە ئامانجی باشترکردنی خزمەتگوزارریەکان و بەگژداچونەوەی گەندەڵی. یەکێك لە باشترین دۆسیانەی کە لەم بوارەدا کە پێویستە عەبادی دەستیان بۆ ببات، بریتین لە:

- دەرماڵەی فەرمانبەرانی دەوڵەت نزیکەی 45 ترلیۆن دینار لە بودجەی عێراق بۆ موچە دەڕوات کە نزیکەی 15 تریلیۆنی موچەی بنەڕەتییەو 30 تریلیۆن دیناریشی دەرماڵەیە، ئەگەر عەبادی ئەو برە دەرماڵەیە بۆ نیوەش کەمبکاتەوە ئەوا نزیکەی 15 تریلیۆن دینار لە خەرجییەکان کەمدەکاتەوە، ئەوەش کاریگەریی زۆری دەبێت.
- لە بودجەی بەکارخستن، پاسەوانێکی زۆر دیاریکراوە بۆ بەرپرسان بەگشتی، بەتایبەت 20 بەرپرس هەن کە فەوجی تایبەتیان هەیەو مانگانە برێکی زۆر لە پارەی دەوڵەتیان بۆ تەرخان دەکرێت، خەرجیی مانگانەی ئەو 20 فەوجە سەربازییە، نزیکەی 10 ملیار دینار کە لە ساڵێکدا دەکاتە 120 ملیار دیناری عێراقی.
- بەشێکی زۆر داهات لە بودجەی عێراق تەرخانکراوە بۆ بابەتی موچەو ئیمتیاز و خانەنشینی پلە تایبەتیەکان، ئەمەش نادادییەکی گەورەی لە نێوان ئیمتیازای فەرمانبەرانی ئاسایی و پلە تایبەتییەکان هێناوەتە گۆرێ،

لەم بارەیەوە پێویستە نوێنەرانی کورد پرۆژەیان هەبێت و هەوڵی کۆتایی هێنان بەم نادادپەروەرییە بدەن و پشتگیری لە گشت هەنگاوێك بکەن کە لەم پێناوەدا دەگیرێتە بەر.

2. سوربون لەسەر بەسزاگەیاندنی تاوانباران و ئەوانەی ناویان لە دۆسیەی گەندەڵی و بەهەدەردانی سامانی گشتی و لاوازکردنی سوپاو بەدەستەوەدانی پارێزگای موسڵ و ناوچەکانی دیکە هەیە، بۆ نمونە لەماوەی 12 ساڵی رابردودا عێراق نزیکەی (1 ترلیۆن) دۆلار زیانی بەرکەوتووە، ئەوەش بەهۆی گرێبەستی وەهمی و پرۆسەی وەبەرهێنان و بەرتیلخۆری و بەهەدەردانەوە. لە ئێستاشدا ئەو 366 کەسەی ناویان لەلایەن ئەنجومەنی دادوەریی و سەرۆك وەزیرانەوە بڵاوکراوەتەوە و رێگری چونە دەرەوەی عێراقیان لێدەکرێت، پێویستە لەلایەن دەسەڵاتی تایبەتمەند وەك بەجێهێنانی هەنگاوی پرۆسەی چاکسازی لێپێچینەوەو بەدواداچون بۆ دۆسیەکانیان بکات.

3. زۆرترین گەندەڵی لە عێراق، لە سێکتەرەکانی نەوت و چەك و تەقەمەنی و کارەبا و خۆراکدایە، بەدیاریکراویش لەو گرێبەستانەی کە لەبواری نەوت و خۆراك و چەکدا کراون و پارەیەکی یەکجار زۆر بە هەدەر دراوە، پێویستە بەدواداچونیان بۆ بکرێت .

4. پێویستە بەئاشکرا پەیامی ئەوە رابگەیەنێت هەر ویستێك بۆ گەڕاندنەوە و بەهێزکردنی ناوەندگەرایی و کۆکردنەوەی دەسەڵاتەکان لەدەستی تاکەسێك، عێراق بەرەو لێکترازانی زیاتر و خراپتربون دۆخی ئەمنی دەبات، ئەوکات چاکسازیەکان شتێك نابن جگە لە دامرکاندنەوەی دەنگی خۆپیشاندەران.

5. بەئاشکرا پێداگری لە سەربەخۆی حکومەتە خۆجێیەکان بکرێت، ئەوەش بەگەڕاندنەوەی دەسەڵاتی لامەرکەزی بۆیان، تا ئەو حکومەتانە بتوانن سەربەخۆیانە دەسەڵاتەکانیان بخەنە خزمەتی هاونیشتیمانیانی پارێزگا جیاوازەکانەوە، نەك بە پێچەوانەوە سەرۆك وەزیران بتوانێت دەسەڵاتی لادانیانی هەبێت، چونکە ئەم ئەنجومەنانە لە بنەڕەتەوە هەڵبژێردراوی هاوڵاتیانن.

6. لەرێگەی چاکسازیەکانەوە ئیستحقاقی نەتەوەیی نەکرێتە ئامانج، چونکە خودی عەبادی لەسەر هەمان بنەما متمانەی هێزە سیاسیەکانی بەدەستهێناوە.

7. پێویستە عەبادی دەستی دەوڵەت دوربخاتەوە لەدامەزراوە سەربەخۆکانی وەك (ناوەندی راگەیاندن، کۆمسیۆنی سەربەخۆی هەڵبژاردنەکان ...)، هاوکات ئەم دامەزراوانە دابماڵێرت لە بەشبەشێنەی حیزبی و مەزهەبیو نەتەوەیی.

8. چاكسازی كردن له دامەزراوەی دادگەری، له سەرەوه بۆ خوارەوه. ئەمه یەكێكه له میكانیزمه گرنگەكانی روبەروبونەوەی گەندەڵی بەسەرجەم شێوەكانیەوه، هاوكات هەوڵبدرێت سەربەخۆی بۆ دەستەبەر بكرێت.

9. دروستكردنی لیژنەی هەماهەنگی بۆ رێكخستنەوه و بەدواداچونی داواكاری خۆپیشاندەران لەسەرجەم پارێزگاكاندا، ئەمەش به هەماهەنگی لەنێوان دامەزراوه بەرپرسەكان، بۆ وەڵامدانەوەی خێرای خۆپیشاندەران.

10. دەوڵەتی عێراقی له دوای 2003 لەسەر بنەمای سازانی پێكهاتەكان و بەشداری فعلیان له بەرێوەبردنی عێراق هاتوته كایەوه، لەسەر هەمان بنەماش دەستور عێراق له ساڵی 2005 نوسراوەتەوه، هەر دەسكاریەك له دەستور دەبێت جگه لەوەی بەرێكاری هەمواركردنەوەی دەستوردا بروات له هەمان كاتدا بنەماكانی سازانی و هاوبەشی له ئیدارەدانی عێراق پێشێل نەكرێت.

11. ئەگەر چاكسازییەكان تەنها له خودی لابردن و گۆرینی كەسەكاندا بكرێن ئەمه ئەوه دەردەخات كه تەنها لێدانی پێگەی حیزب و لایەنەكان و كەسەكانه. بەڵام ئەگەر باس له چاكسازی بكرێت پێویسته گشتگیر بێت و لەسەر و هەمووشیەوه دەبێت چاكسازییەكان تەوەری كارگێری و ئیداری بگرێتەوه لەسەرجەم دامودەزگاكانی حكومەت و دامەزراوەكاندا (پلاندانان، رێكخستن، ئاراستەكردن و چاودێریكردن)

12. چاكسازی له سیاسەتی ئابوری و دامودەزگاكانی تر و سێكتەرەكانی بەرهەمهێنان به گشتی و بوژاندنەوەی ژێرخانی ئابوری.

13. چاكسازی له یاساكانی سێكتەری (اتصالات) له عێراقدا، لەگەڵ نەهێشتنی قۆرغكاری لەم سێكتەرەدا، هەروەها پێداچوونەوەی ئەو باجانەی لەسەر كۆمپانیاكانی ئەم بواره هەیه، چونكه ئەم بواره دوای نەوت باشترین و زۆرترین داهاتی هەیه له عێراقدا.

14. چاكسازی له سیاسەتەكانی مالی و نقدی كه له ئێستادا بۆ باشتركردن و زیادكردنی داهات دوو هۆكاری گرنگن.

15. لەبری لابردنی راوێژكاران و دامەزراندنی چەند كەسێكی تر وەك راوێژكار و پركردنەوەی پۆست، دەستەیەك كۆمسیۆنێك دروست بكرێت له راوێژكاران بەشێوەیەكی بەردەوام و گشتگیر له سەرجەم بوارەكاندا.

## سەرچاوەکان


1. دەستوری هەمیشەیی عێراق

2. چاوپێککەوتن لەگەڵ "مسعود حەیدەر - ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق"

3. چاوپێککەوتن لەگەڵ "محمود ڕەزا ئەمین- ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق"

4. وەزارەتێکی کوردی تێدایە عەبادی حکومەتەکەی لە 33 وەزارەتەوە بۆ 22 وەزارەت کەمکردەوە، لەسەر پێگەی ئەلیکترۆنی:
http://www.sharpress.net/Direje.aspx?Jimare=40941
5. جێگرێکی عەبادی دەستیلەکارکێشایەوە، لەسەر پێگەی ئەلیکترۆنی:
http://www.sharpress.net/Direje.aspx?Jimare=40631
6. عەبادی قۆناغی سێهەمی چاکسازی ڕاگەیاند، لەسەر پێگەی ئەلیکترۆنی:
http://www.speemedia.com/dreja.aspx?=hewal&jmare=23772&Jor=2
7. وەزیری گواستنەوەی عێراق دەستیلەکارکێشایەوە، لەسەر پێگەی ئەلیکترۆنی:
http://www.sharpress.net/Direje.aspx?Jimare=40809
8. لایەنە عێراقییەکان ترسیان لەتەقینەوەی خۆپیشاندانەکان هەیە، لەسەر پێگەی ئەلیکترۆنی:
http://www.sharpress.net/Direje.aspx?Jimare=41433
9. عەبادی 123 بریکارو بەڕێوەبەری گشتی لەکارەکانیان دورخستەوە، لەسەر پێگەی ئەلیکترۆنی:
http://www.sharpress.net/Direje.aspx?Jimare=42827
10. ئەمریکا پشتگیری چاکسازییەکانی عێراق دەکات عەبادی پەیوەندییەکی تەلەفۆنی لەجۆ بایدنەوە پێدەکات، لەسەر پێگەی ئەلیکترۆنی:
http://www.sharpress.net/Direje.aspx?Jimare=41790
11. تارمایی جیابوونەوە بەسەر حزبی دەعوەوە، لەسەر پێگەی ئەلیکترۆنی:
http://www.knwe.org/Direje.aspx?Cor=5&Besh=Witar&Jimare=36690
12. هەولێکی مالکی دژی عەبادی ئاشکرا دەبێت، لەسەر پێگەی ئەلیکترۆنی:
http://rhewal.com/news.php?id=790
13. جۆ بایدن بۆ حەیدر عەبادی دوویاتدەکاتەوە ئەمەریکا بەردەوامە لە پشتیوانیکردنی عێراق، لەسەر پێگەی ئەلیکترۆنی:
http://www.dengiamerika.com/content/biden-iraq/2953638.html
14. ئەمریکا پشتیوای خۆی بۆ چاکسازییەکانی عەبادی ڕاگەیاند، لەسەر پێگەی ئەلیکترۆنی:
http://www.kurdsatnews.com/?p=45370
15. ئیدارەی کۆشکی سپی پشتیوانی خۆی بۆ چاکسازییەکانی عەبادی ڕاگەیاند، لەسەر پێگەی ئەلیکترۆنی:
http://www.kurdsatnews.com/?p=44186
16. عەبادی، ئەم وەزارەتانەی هەڵوەشاندەوە، لەسەر پێگەی ئەلیکترۆنی:
http://xendan.org/dreja.aspx?=hawal&jmara=46753&Jor=2
17. مالیکی دەگەڕێتەوە بەغداو تەحەدای عەبادی دەکات، لەسەر پێگەی ئەلیکترۆنی:
http://knnc.net/Drejey-hawal.aspx?id=57726&LinkID=5&video=True&leguaid

18. عەبادی (123) بریکاری وەزیر و بەڕێوەبەری گشتی لە پۆستەکانیان دوردەخاتەوە، لەسەر پێگەی ئەلیکترۆنی:
http://sbeiy.com/Article-7154
19. وەرەقەی یەکەمی چاکسازیی عەبادی و خەرقە قانونی و دەستورییەکانی، لەسەر پێگەی ئەلیکترۆنی:
http://sbeiy.com/Article-5445
20. عەبادی پرۆژە چاکسازییەکانی رادەگرێت، لەسەر پێگەی ئەلیکترۆنی:
http://sbeiy.com/Article-6683
21. پەرلەمانی عێراق پرۆژەکەی عەبادی پەسەند کرد، لەسەر پێگەی ئەلیکترۆنی:
http://sbeiy.com/Article-5341
22. عێراق؛ دەستەی نەزاهە ناوی تۆمەتبارانی گەندەڵی دەداتە فڕۆکەخانەکان، لەسەر پێگەی ئەلیکترۆنی:
http://sbeiy.com/Article-5429
23. سەرۆک کۆمار پشتیوانی بڕیارەکەی عەبادی دەکات.. بڕیارەکان بە (3) قۆناغ جێبەجێ دەکرێن، لەسەر پێگەی ئەلیکترۆنی:
http://sbeiy.com/Article-5312
24. عەلاوی: بڕیارەکانی عەبادی پێشێلکردنی دەستورن، لەسەر پێگەی ئەلیکترۆنی:
http://sbeiy.com/Article-5320
25. "ئەستەمە بڕیارەکانی عەبادی جێبەجێ بکرێ"، لەسەر پێگەی ئەلیکترۆنی:
http://sbeiy.com/Article-5309
26. عەبادی چاکسازییەکانی دەستپێکرد.. (سبەی) دەقی بڕیارەکان بڵاودەکاتەوە، لەسەر پێگەی ئەلیکترۆنی:
http://www.sbeiy.com/Article-5281
27. پەنجا هەزار دۆلار لە پەرلەمانتارانی عێراق دەبڕدرێت و (22) پاسەوانیشیان کەمدەکرێتەوە، لەسەر پێگەی ئەلیکترۆنی:
http://sbeiy.com/Article-5401
28. عەبادی بڕیاریدا (90%)ی پاسەوانی بەرپرسان و سێ سەرۆکایەتییەکە کەمبکاتەوە، لەسەر پێگەی ئەلیکترۆنی:
http://sbeiy.com/Article-5613
29. چاکسازییەکانی عەبادی فەوجی چەندین بەرپرسی کورد دەگرێتەوە، لەسەر پێگەی ئەلیکترۆنی:
http://sbeiy.com/Article-6673
30. موچەی بەرپرسانی عێراق بەمشێوەیە کەمدەکرێتەوە، لەسەر پێگەی ئەلیکترۆنی:
http://sbeiy.com/Article-7142
31. بڕیارەکانی عەبادی بۆ چارەسەر باشن، بەڵام.. ، لەسەر پێگەی ئەلیکترۆنی:
http://sbeiy.com/Article-5349

32. إصلاحات العبادي - مطلب جماهيري وصعوبة في التنفيذ، على الموقع الالكتروني:
http://www.dw.com/ar/%D8%A5%D8%B5%D9%84%D8%A7%....
33. عماد رسن، إصلاحات العبادي والدولة العميقة، على الموقع الالكتروني:
http://www.newsabah.com/wp/newspaper/58251
34. أذرع المالكي تتحرك بغطاء سياسي للتشكيك في إصلاحات العبادي، على الموقع الالكتروني:
http://www.middle-east-online.com/?id=206157
35. كيف نفهم إصلاحات العبادي في العراق؟، على الموقع الالكتروني:
http://www.noonpost.net/%D8%A7%D9%84%D9%88%D8%...

36. كربلاء تؤيد إصلاحات العبادي وتطلق "الحشد الخدمي" لتقويم أداء دوائر المحافظة، على الموقع الالكتروني:
http://www.almadapress.com/ar/news/53396/%D9%83%D8%...
37. العراق: إيران تسارع لإجهاض الحراك الشعبي وتعطيل إصلاحات العبادي، على الموقع الالكتروني:
http://www.alghad.com/articles/887758-%D8%A7%D9%84%D8...
38. هل أقدم العبادي على الإصلاحات الأخيرة رغم إيران ؟، على الموقع الالكتروني:
http://www.alquds.co.uk/?p=389311
39. صحيفة أمريكية: إصلاحات العبادي تواجه تهديدا من سماسرة السلطة وصراع القوى الشيعية المتنافسة، على الموقع الالكتروني:
http://www.alquds.co.uk/?p=389586
40. الوليد خالد، اصلاحات العبادي!! تطهير أم تنظير؟، على الموقع الالكتروني:
http://www.kitabat.com/ar/print/57764.php
41. واشنطن تؤيد إصلاحات العبادي وتتعهد بإرسال خبراء في الطاقة، على الموقع الالكتروني:
http://www.alaraby.co.uk/Print/9f48bcd0-a029-4e10-b363-6e2b89f51683/ee525bf8-2582-4388-adc4-ca92d714797a
42. موقف ايران من إصلاحات العبادي: دعم أم مكافحة؟، على الموقع الالكتروني:
http://alwaght.com/ar/News/16121/%D9%85%D9%88%D9%...
43. بالوثائق ... (واخ) تنشر اسماء المسؤولين الممنوعين من السفر، على الموقع الالكتروني:
http://www.khabaar.net/index.php/permalink/50770.html
44. مفهوم الدولة العميقة _ 1. ميلاد الدولة العميقة، على الموقع الالكتروني:
http://www.sutuur.com/all-articles/8837-emad.html
45. إصلاحات العبادي والدولة العميقة، على الموقع الالكتروني:
http://elaph.com/Web/opinion/2015/8/1031687.html
46. قرارات رئيس الوزراء العراقي "حيدر العبادي" بالتفصيل وكما وردت من رئاسة الوزراء، على الموقع الالكتروني:
http://n.annabaa.org/news1038
47. مقالات:كيف نفهم إصلاحات العبادي في العراق؟، على الموقع الالكتروني:
http://www.noonpost.net/%D8%A7%D9%84%D9%88%D8%B6...
48. واشنطن تؤيد إصلاحات العبادي وتتعهد بإرسال خبراء في الطاقة، على الموقع الالكتروني:
http://www.alaraby.co.uk/politics/2015/8/18/%D9%88%D8%...
49. هل أقدم العبادي على الإصلاحات الأخيرة رغم إيران ؟، على الموقع الالكتروني:
http://www.alquds.co.uk/?p=389311
50. رئيس مجلس الوزراء الدكتور حيدر العبادي يتلقى اتصالا هاتفيا من نائب الرئيس الامريكي السيد جو بايدن، على الموقع الالكتروني:
http://www.pmo.iq/press2015/9-9-20151.htm
51. قرارات مجلس الوزراء، على الموقع الالكتروني:
http://cabinet.iq/ArticlesBrowse.aspx?CatID=6
52. رئيس الوزراء الدكتورحيدر العبادي، على الموقع الالكتروني:
http://www.pmo.iq/
53. ماذا بحث العامري والمهندس مع مدحت المحمود
http://www.khabaar.net/index.php/permalink/51394.html